لەسەرباز دێت کەشایانی ئەو فرمانە پیرۆزەی هەبێ.

ئەمجا لەناو ئەم شەعبەدا ـ کە بەم جۆرەباسکرا ـ ئەگەر یەکێک ئەوی پێویستی «شەعبیەتە» بەجێ نەهێنا مەعنای وا نیەکە شەعبەکە هەمووی بێ کەڵک و شایانی هیچ شتێک نیە. [شەعب] وە یا قەوم ئەبێ چاکێشی تێدا هەبێ و خراپیش، رێ ناکەوێ هەمووی چاک بێ وەکوو ئەوە رێناکەوێ کە هەمووی خراپ بێ.

لە قەومێکا ئەگەر هات و یەکێکیان وە یا چەند کەسێکیان خراپەو خراپەکاریان بەرانبەر بە قەومەکەی خۆیان وە یا قەومێکی تر نواند مەعنای وانیە ئەو [قەومە]کەوا ئەو چەند خراپەکارەی تێدا هەڵکەوتووە هەمووی خراپن، هەرکەس بە هۆی خراپی چەند کەسێک لە قەومێکا «حوکم» بدا بە سەر خراپی ئەو قەومە ـ دا، ئەوە گوناح و ناپیاوەتیە کە بەرانبەر بە ویژدان و بەرانبەر بە [تأریخ] ئەینوێنێ.

ئەو قەومە وەختێک هەموویان خراپ ئەبن کە تێکرا هەموو دەمارو خوێنیان پڕبێ لە بیروباوەڕی پیاوە خراپەکەی کە تیایانا هەڵکەوتووە. ئەمەش لە زۆرور مەحاڵەوەیە؛ چونکە تا ئەو بەرەیە و بەرەی دوای ئەوان وایان لێدێ کە ئەو مەفکۆرەیە پڕ بەپڕی مێشکیان بوەستێ ماوەو زەمانێکی ئەوێ. لە «ستی کون»ە کە چەرخی زەمان ئەوەندە راناوەستێ تا ئەوان بگەنە ئەو پایەیە. کە رانەوەستا گۆڕان بەسەرا دێت، کە گۆڕان هات ئەونی کابرای پیاوخراپ هەموو شیتاڵ شیتاڵ ئەبێتەوە!.

بەڵێ یەکێکی خراپ بۆ ئەوە [نەفسی] پیسی خۆی لەهەموو جەورێک پڕبکات وای بە تۆ پیشان ئەداکە فلانە قەوم هەمووی خراپن، بەرانبەر بەم کابرا خراپە خراپێکی تریش لەقەومەکەی ترا، پەیدا ئەبێ و ئەویش بە چەشنی باوەڕ ئەڵێ [فلانە قەوم] هەموویان خراپن. بە هۆی ئەم دووکەسەوە ناڕەوایەک و بێ باوەڕیەک لەبەینی ئەو دوو قەومەدا پەیدا ئەبێ وکەچی لە راستیشا هیچی وانیە.

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەوە، ئەوە بۆ ئێمە دەرکەوت کە قەومی عەرەب، وەیا

کورد، وە یا فارس ـ ئەمانە بە میسال ـ نابێ ئەفرادی ئەمەیان زەمی قەومەکەی‌تر بکەن بڵێن هەموویان خراپن. چەکوردە چە عەرەبە، چە فارسە؛ بێ‌شکەکە چاکێشیان تێدا هەیە و خراپیش. کەوابوو من لێرەدا هەندێ جار کە ئەڵێم: «فارس وە یا عەرەب وە یا کورد». ئەوەیان کرد و ئەوەیان کرد، ئەوە دیارە مەبەست ئەو کەسانەیەکەوا بۆ پاراستنی کورسی و پایەی خۆیان جەور و ستەمەکەیان وەکوو دووکەڵێکی رەش وایە قەومەکەی خۆیشیان و قەومێکی‌تریش ئەگرێتەوە. جا ئەو جۆرە کەسانانەن کە بوون بە پشیلە نەوتینە و بە ناو قەومەکانا ئەسوورێنەوە!.

* * *

شۆڕشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق ئەم هەموو ئاژاوانەی لەدەری عێراقا نایەوەو لەو هەموو تەلبەندانەی بەسەر بەکا تێکدا.

سەربازی عێراق و شەعبی عێراق ـ بەکورد و عەرەب ـەوە دەمێ ساڵە لەجەنگی نالەوەی شۆڕشێکی وادابوون، پاش (١٩١٨) وەنەبێ ئیتر هەر وا بە بێ‌دەنگ و سەنگ دانیشتبێتن. شۆڕشەکانی بەینی دوو لاپەڕەی (١٩٢٠ـ١٩٣٠) عەرەب لە عەرەبستانا و کورد لە کوردستانا ئەم گەواهیانە ئەدەن. لە (١٩٣٠)دا ئینگلیز و «نوری سعید» لایان وابوو بە پەیمانەکە هەموو ئیشێکیان تەواو کردووە، کەچی شۆڕشی (١٩٣٦)ی «بەکرسدقی» بەسەراهات!. ئەوە کوژێنرایەوە شۆڕشی (١٩٤١)ی بەسەراهات. لە [٢٤ـ٢٧ی کانوونی دووهەمی ١٩٤٨]دا شۆڕشە بەناوبانگەکەی گۆبەنی «پورتسموف» بووکە شەعبی عێراقی (٧٠) کوژراو و (٤٠٠) برینداری‌دا بە دەستەوە. لە (١٩٥٢)دا لە پاش ئەوەکە لەلایەن دەورو دووکانی پێشووەوە هەموو بەندیخانەکان پڕکران شۆڕشێکی‌تر دەستی پێ‌کرد بەڵام حوکم درایە دەست سەرۆکی عەسکەری ئەو وەختە و ئەویش دیسان شۆڕشی کوژاندەوە، لە (١٩٥٦)دا عەینی دەور دەستی پێ‌ کردەوەو عەینی سەرەنێزەی جەور دایمرکاندەوە!.

لە هەریەک لەسەر نەگرتنی ئەم شۆڕشانەدا دەرزێک وەرگیرا و لەهەر سووچێکیەوە هیوایەک وەرگیرا. کەوابوو شۆڕشی (١٤)ی تەمووز شتێکی کوتووپڕی نەبوو، بەڵکوو وادیار بوو بناغەکەی دەمێک ساڵ بوو دانرابوو، بەڵام هێشتا پوختە نەبووبوو بۆیە لە ساڵەکانی پێشووا هیچ بەرێکی نەدا بەدەستەوە.

دەمێک بوو هەموو کەس بێزی ئەهاتەوە لەو دەورو دووکانە، سەیرتر ئەوەبوو کابرا وەزیر بوو کەچی ئەویش هەر بێزی لێ ئەهاتەوە!. دەمی هەرکەست ئەکردەوە لە گەورە و بچووک، لە خوێندەوار و نەخوێندەوار، لە ئەفسەر و لە ئەفەندی هەموو لەو دەورو دووکانە دڵ بریندار بوون، وادیار بوو تەنها «عبدالاله» و «نوری سعید» و چەند کەسێک لە باشچاوشەکانیان نەبێ ـ لەبەرگومڕاهی ـ ئەگینا هەموو دانیشتووێکی عێراق دڵی بووبوو بە دانەی سەرساج!. هەر ئەوگومڕاهیەبوو کەوای لێ کردبوون هەموو کۆششێکیان بۆ بەرز بوونەوەی مەملەکەت بخەنەسەر زۆر کردنی «جاسوس» و کڕینی ویژدان، کەچی ئەوەش هەر کەڵکی نەگرت بۆیان!.

شۆڕشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق، شۆڕشی پاڵەوانی نەبەز «عبدالکریم قاسم»ە. عبدالکریم قاسم [زعیم رکن] بوو لە نەیروی عێراقا، پیاوێکی هێمنی لەسەر خۆی خاوەن بیروباوەڕێکی قایم بوو، حەزی بەخۆ دەرخستن و عەنعەنات نەئەکرد، هەر لەبەر ئەم هێمنی و خۆدەرخستنەی بوو.که «عبدالاله» و «نوری سعید» و ئەو هەموو دەستوپێوەندەیان نەیانتوانی لەو باوەڕە قایمەی [عبدالکریم قاسم] تێ بگەن لە گەڵ ئەوەشا کە زۆر دەمێک بوو ئەو باوەڕە هاوڕێ [عبدالکریم قاسم] بوو!.

[عبدالکریم قاسم] بێجگە لەوەکەوا کاروباری ناڕەوای حوکومەتانی پێشووی عێراق کارێکی زۆریان کردبووە دڵی و بێجگە لەوەکە فیکری لە پیاوانی عێراق ئەکردەوە؛ ئەو پیاوانەکەوا لە دایەرەکانا و لە سوپادا فرمانی گەورە گەورەیان گرتووە بەدەستەوە لەباتی ئەوە خزمەتی وڵاتەکەیان بکەن کەچی هەموو کۆششێکیان خستۆتە

سەر جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی [عبدالاله] و [نوری سعید] ـ کە فەرمانی ئەوانەش هەر بۆ پێشکەوتنی کاروباری ئینگلیز و ئەمەریکا و دواخستنی مەسالحی عێراقە ـ بێجگە لەم باوەڕەی کاتێ کە لە تشرینی (١٩٥٦)دا فەرمانی کرابە سەرکە بەخۆی و لواکەیەوە ـ لوای (١٩) کە لەمەنسووریەبوون ـ بچێت بۆ ولاتی «أردن» گۆیا بەناوی ئەوەوە کە لە «جوولەکە» بدەن!. کەچی لە ڕێگەدا سەیر ئەکا ئەمە وانیە، بەڵکوو ئەمە لە مەعنادا بۆ یارمەتی «جوولەکە» و لە «میسر»دانە!. دیارە نەفسیەتی «عبدالکریم قاسم» بێزی لەمە دێتەوە و شتی واناکا.

لەو وەختەوە بەتایبەتی ـ ئەڵێم لەو وەختە بە دواوە، ئەگینا بەگەلێ ساڵ پێش ئەو وەختەش ئەو فیکرەی هەر هەبوو ـ کەوتە سەر فیکری ئەوەکە بەهەر جۆر بووە ئیشێکی وابکا، ئەم ولاتە لەدەست ئەو گورگە خائنانە رزگارکا. فیکرێکی زۆر زل بوو کردبەوە، تەنها دڵە پڕ لە هێز و نهێنیەکەی [عبدالکریم قاسم] نەبێ کەسێکی‌تر ناتوانێ ئەو فیکرە لەدڵیا بە نهێنی بێڵێتەوە تا دێتە سەروبەری بەئەنجام گەیاندنی.!

کە لەو سەفەرەی گەڕایەوەو گەیشتە [ئیچ ـ ثری] بڕیاری سەرەتای دەرخستنی شۆڕشێکی‌دا، بەڵام لەوێ بەباشی نەزانی چونکە سەیری کرد ئەوانەی کەوا لەم داوە ناهەموارانە بۆ عێراق ئەنێنەوە ـ کە وەکوو عبدالاله و فیصل و نوری سعید و دەست و پێوەندەکانیان بن ـ هەموویان لەوێ نین. سەیری کرد ئەگەر هەندێک لەوانە بەرپەل کەون و هەندێکیان دەرباز بین بێ گومان ئەو ئامانجەکە ئەو هەیەتی بە شۆڕش، بۆی پێک نایە. لەبەر ئەمە وازی لێ هێنا.

لەم ماوەیەدا هەر خەریکی تاقی کردنەوەی یەکە یەکەی ئەفسەرەکان بوو، خەریکی ئەوەبوو بزانێ ئایاکامیان لەمەحەک دەرئەچن. خەریکی ئەمەبوو بەبێ ئەوە سەرەتا باوەڕی خۆیشی لەلای یەکێک بدرکێنێ. لە نەتیجەی تاقی کردنەوەیەکی زۆرا توانی چەند ئەفسەرێکی زۆر کەم بدۆزێتەوە؛ لەو ئەفسەرانە کە جێگەی باوەڕ و سنگیان

گۆڕێکی بێ دەنگە بۆ هەموو نهێنیەکا. ئەم چەند دانەیەش کە دۆزیەوە «مەرج» نەبوو کە ئەبێ هەر لەلواکەی ئەوابن. یا هەر یەکە لەلایەکێش بن مادام هەموویان هەر بۆ مەبەستێکی پیرۆز کۆشش ئەکەن هەر وەکوو ئەوە وانەکە لەلای ئەوبن.

بەتایبەتی هەندێ لەوانەی کە من پێ بزانم و بەرە بەرە ئاگاداریان بەسەر نهێنیەکانی «عبدالکریم»دا پەیداکرد و بەناوی «ئەفسەرانی ئازاد»ەوە ناوی نان ئەمانەبوون: ـ

«فریق نجیب ربیعی». ئەم پیاوە خۆشەویستیەکی تایبەتی لەناو سوپادا هەبوو وە بە دڵ هۆگری عبدالکریم ـ یش بوو. هەرچەندە لە رۆژی گیرانی شۆڕشەکەدا ـ رۆژی ١٤ی تەمووز ـ لە [حجاز] بوو، بەڵام ئاگای لە هەموو کاروفرمانێکی کۆمەڵە هەبوو.

[زعیم رکن محی‌الدین عبدالحمید، زعیم رکن أحمد صالح عبدی، زعیم رکن خلیل سعید، زعیم فؤاد عارف، زعیم حسن عبود، زعیم داودسەلمان جەنابی، زعیم ناجی طالب. عقید فاضل عباس مهداوی، عقید ماجد محمد أمین، عقید عبدالکریم جدە، عقید مهندس رجب عبدالحمید، عقید فتاح شاڵی، عقید رفعت حاجی‌سری، عقید عبدالوهاب أمین، عقید شمس‌الدین عبدالله، عقید وصفی طاهر، عقید طاهر یحیی، عقید عادل جلال، عقید عبداللطیف دراجی، عقید محسن حسین الجیب، عقید رجب عبدالمجید، عقید عبدالسلام محمدعارف، عقید عبدالله سعید[1].]

[مقدم عبدالغنی عبدالستار، مقدم محمد مجید، مقدم عبدالکریم فرحان، مقدم شاکر محمود سلام، مقدم خضر حسین دوری، رەئیس ئیبراهیم لامی، رەئیس عبدالستار عبداللطیف، رەئیس ئیبراهیم جاسم، رەئیس مصطفی عبدالله، رەئیس جاسم عزاوی، رەئیس سلیم فخری، رەئیس ثامر نورالدین.]

بەڵێ ئەمانە سەرەتا بەگیانێکی پاکەوە لەژێر راو تەگبیری عبدالکریم قاسم ـ دا

---

١ ـ عبدالله سعید هەرچەندە بەراستەو راست پێ نەوتبوو، بەڵام لەبەر ئەوەکە خۆی بەجێ بڕوای عبدالکریم قاسم ئەزانی وە عبدالکریم ـ یش ئەمەی ئەزانی وەکوو ئەوە وابووکە پێ وتبێ.

پەلاماری پێکهێنانی شۆڕشی (١٤)ی تەمووزیان دا و ناوێکی پڕ لە شانازی‌یان بۆ خۆیان وەرگرت. بەڵام داخەکەم زۆری پێ نەچوو هەندێک لەمانە ئەو ناوە پڕ لە شانازیەیان گۆڕیەوە بە ناوێکی پڕ لە نەنگی و لەککەداری و نووسانیان بەسەرشانی خۆیانەوە!..

بەقسەو پڕ و پاگاندەی هەندێ لە پیاوە نەفعی پەروەرەکانی وڵاتی عەرەبستانی غەیری عێراق کەوتنە بزووتنەوەو گزی کردن لە نیشانەکانی شۆڕشی (١٤)ی تەمووزا.. لێبووردنی «عبدالکریم قاسم» گەلێ زیاتر بوو لەوە، کە بە چاوی خەشمەوە ئاوڕ لەمانەبداتەوە. ئەو دەستەیە وایان ئەبردە دڵی خەڵکەوە، کە شۆڕشەکانی پێشووی عێراق و ئەمجارەش هەر لە کۆششی ئەمانەوە بووە و بەم قسەیە ئەیانویست وڵاتی عێراق راکێشن و بیخەنە ژێر دەستی نەفعی پەروەرەکانی وڵاتی عەرەبستانی دەرەوەی عێراق!.. عبدالکریم قاسم هەر بەچاوی لێ بووردن و میهرەبانیەوە سەیری کردن، ئەمەش بۆ ئەوە کە بەڵکوو ئەمانە لەم باوەڕە چەوتەی خۆیان بگەڕێنەوەو نەبێ بە ئاژاوەو ئاو لێڵ کردن. ئەمانە هەر نەگەڕانەوە تا لە ئاخراکردەوەی ناپەسەندی خۆیان رایکێشیان بۆ ئەوە تۆڵەی ناپیاوەتی خۆیان وەربگرنەوە!.

[عبدالکریم قاسم] هەر لایەنی هێمنی و لێبووردنی لەدەست بەرنەدا. کەچی لەناکاو، لە رۆژی (١٩٥٩/٣/٩)دا عبدالوهاب شواف ـ کە وەختی خۆی یەکێک بوو، لە ئەفسەرانی ئازادی شۆڕشی (١٤)ی تەمووز ـ ئەو ناوە پڕ لە ئیفتخارەی پێ هەڵنەگیرا و بە پڕوپاگاندەی [جەمال عبدالناسر]ی وڵاتی میسر، لە «مووسڵ» ئاگرێکی یاخی بوونی لە «عبدالکریم قاسم» و شۆڕشی (١٤)ی تەمووز هەڵگیرساند و ویستی ناوە پاکەکەی عێراق لەککەدار بکا!. ئەوەندە هەبوو [عبدالکریم قاسم] دەستی لە دەستی ئەو و لە دەستی یاریەدەرەکەی ئەو بەهێزتر و درێژتربوو، بۆیەش درێژتر بوو چونکە شەعبی عێراقی بە کورد و عەرەبە وەکوو پوورەی هەنگ دەوریان لێ داوە و بە پێشەوایەکی راستی راستەقینەی خۆیان ئەزانن، یەکێک ئەوەندە خۆشەویست بێ و لە هێلانەی دڵی هەموو

کەسێکایێ، بێ گومان هەر بەهێزو سەرکەوتوو ئەبێ.

لە ئاخری ئەم کردەوە ناپەسەندەدا دەستەی عبدالوهاب و یاریە دەرەکەی بۆ ماوەی (٢٣) سەعات هەر ئەوەیان بۆ مایەوە کە نلوێکی نەنگباری و خیانەتکارانەیان بۆ هەتا هەتایی بۆ خۆیان وەرگرت و هیچی ترا.

* * *

[عبدالکریم قاسم] لە ناو ئەو ناوچە عەسکەریەدا کە ئەژیا پیاوێکی خۆشەویست بوو، لاپەڕەی ڕووناکی ژیانی هەموو ناوچەکەی کردبوو بە پەروانەی دەوری خۆی، لە هیچ کاتێکا شتێکی وای لێوە دەرنەکەوت کە ببێ بە هۆی دڵڕەنجاندنی سەربازێک وە یا ئەفسەرێک. ڕواڵەت و کردەوە ڕواڵەتیەکانیشی وای پیشان ئەدا کە لەناو ئەفسەرانی سوپادا یەکێکی تر نیە وەکوو ئەو سەر بە بنەماڵەی پادشاهی و «نوری سعید» بێ!. تەنانەت لەم ڕووەوە بووبوو بە شوێنی ڕەخنەی هەندێ لەوکەسانەکە ئاگاداری ناو پەردەی دڵی نەبوون.

ئەو قوتابیانەش کە لەم ماوەیەدا پێکیەوە نابوون ئەوانیشی هەر لەسەر ڕەوشتی خۆی فێری کردبوون، وانە لەرواڵەت و کردەوەیانا هەموو وایان ئەنواند کە هەتا ئەو پەڕی دڵسۆزییان هەیە بە بنەماڵەی شاهی!. کردەوەو بزووتنەوەی کۆمەلایەتی کە ئەیانکرد وادیاربوو، تا (١٩٥٥) دەرزێکی تەواوی کۆمەڵەی نهێنیان نەخوێندبوو بۆیە «نوری سعید» و دەست و پێوەندەکانی جۆرە هەستێکیان پێیان کرد و هەر یەکەیان دوور خستنەوە بۆ وڵاتێک. لە (١٩٥٦)دا دەرزیان لە هەڵەکانی پێشوو وەرگرت، ئەمجا ئەو ڕێگەیانە گرت کە باسمان کردن. بە هۆی گرتنی ئەم ڕێگەیەوە وردە وردە دڵی «نوری سعید»یان پاک کردەوەو «کۆمەڵەی ئەفسەری ئازاد» بەرە بەرە بۆ، یەک، تێ کەوتن تا کۆبوونەوە وە یا، لێک نزیک کەوتنەوە.

ڕێگەی ئەم کۆمەڵە بێجگە لە «بلاوکراوە»کەیان کە ناویان نابوو «دەنگی سەرباز» و

لەساڵی (١٩٥٢)دا بەکەم ژمارەیان دەرکردو تا ماوەیەک هەر لەسەری رۆیشتن، بێجگە لەوە نەیانویستووە هیچ شتێکی تری چاپکراویان هەبێ، بەتایبەتی کە هەموو دەرزەکانیان وەرگرت و لە هەموو هەڵەکانی پێشوو تێ گەیشتن هەر فەرمان و تەگبیرێکیان بووبێ هەموویان بە زمان بەیەک وتووە و نەیانویستووە بکەوێتە سەرقاقەزا. کەم جاریش رێ کەوتووە کە کۆبوونەوەیەکی نهێنی بۆ ئەم ئیشەی خۆیان بکەن، بەڵکوو زۆرتر شوێنی قسەو کۆبوونەوەیان لەنادی وە یا لۆقەنتەی ئەفسەران، وە یا ئەو دیواخانانە بووە، کە زۆرتر دانیشتووەکانی لە ئەفسەرانی غەیری ئەم کۆمەڵەیە بوون!. لەگەر وەختی واش بووبێ لە کۆبوونەوەکەدا دەمیان نەگەیشتبێ بەیەک بەچاو وەیا، بە ئیشارە فرمانەکەی خۆیانیان بەیەک تێ گەیاندووە. لەمانەش هەموو [عبدالکریم] بەو جۆرە دەرزی داون و رێگەی بۆ داناون. هەر ئیشێک کەویستبێتیان بیکەن [عبدالکریم] نەخشەکەی کێشاوەو بەدەم بەیەکێکی وتووە و ئەویش بەیەکێکی تر، واتە وەکوو هەڵقەی زنجیر.

باوەڕ هەتا ئەهات قایمتر ئەبوو، هێزی [عبدالکریم] و ئەفسەرانی ئازاد رۆژ بەرۆژ زیاتر پەرەی ئەسەند. [عبدالکریم] هاتە سەر ئەوە کە رۆژی [٦ی کانوونی دووهەمی ١٩٥٨] ئاگری شۆرش هەڵگیرسێنێ، دیسان لەبەر کۆبوونەوەی ـ عبدالاله و فیصل و نوری ـ هەرسەری نەگرت. ویستی لەرۆژی کۆبوونەوەی دەرچوونی قوتابیەکانی کوللیەی جەنگدا بیگێرێ، لێرەشا سەری نەگرت چونکە شازادەکان کۆنە بووبوونەوە.

* * *

«نوری سعید» و «عبدالاله» بڕیاریان دا لوایەکی دڵسۆزی سەربەخۆیان بچێت بۆ [أردن]، چوار مانگ لەوێ بێ و بگەڕێتەوە. چوونی ئەم [لوا]یەش لەبەر ئەوەیە کە گۆیا ئێستە ـ عێراق و أردن ـ بوون بە یەک و ئەبێ لە هەموو روویەکەوە یارمەتی یەک بدەن، نەوەک لە حوکوومەتی أردن ـ دا دوژمنەکانی دەرەوەی تەیەتیان تێک بدەن! ئەم [لوا]یە بچێت بۆ ئەوە کە ئەو دوژمنانە ئیتر نەوێرن فیکرێک بکەن!. لەمە، شتێکی

قانوونی بوو لەبەینی ـ عێراق و أردن ـ داکەس ناتوانێ رەخنە لە قانون بگرێ!. کەوابوو ناردنی [لوا]کە، ئەبێ بەم ناوەوەبێ، بەلاّم لەژێرەوە وانەبوو، ناردنی ئەم لوایە بۆ ئەوەبوو کە لە [لوبنان]دا یارمەتی «شەمعون» بدا و نەیەڵن دوژمنەکانی «شەمعوون» دەستبزێوی بکەن، شەمعون لە ژێرەوە لەگەڵ شاوشازادەی عێراق یەکێکە چۆن ئەبێ یاریدە نەدرێ؟!. ئەوەندە هەیە پەیمانێک لەبەینی عێراق و لوبنانا نیە هەتا بە ئاشکرا بتوانن یارمەتی بدەن، ئەگەر راستە و راست بڵێن چوونی ئەم لوایە بۆ لوبنانە قسەو باس لە لایەن «شەعب» و نەیروەوە پەیدا ئەبێ، بەلاّم بوترێ بۆ أردن ـە ئاو ئەکرێ بە ئاگرا و هیچ قسەیەک پەیدا نابێ!..

لە رۆژی [١٠-١١ی تەمووزی ١٩٥٨]دا عبدالاله لەلایەکەوەو نووری سەعید لەلایەکەوە لە ئەستەمۆڵ بوون. نووری لەگەڵ حوکوومەتی ئەستەمۆڵدا قسەی تەواو کرد، کە لە رۆژی (١٤)ی تەمووزدا بۆ پەیمانی بەغدا ئەندامە هەرەزلەکانی حوکومەتانی هاوبەش لەوێ کۆبینەوەو بۆیەیەکی قەتمەرتر بەسەر پەیمانی بەغدادا بێنن، دوورنیە بۆکوشتن و لانکردلی عێراق بێ ئەوەندەیترا.

هەر لەو رۆژەوە [شەقامی ئیستقلال]ی ئەستەمۆڵ رێک‌خرا، بەیداخەکانی ئێران، پاکستان، عێراق، تورکیا، ئەمەریکا و ئنگلترەی پێیا هەڵواسرا. تەنانەت گسکێشیان لێ‌دا!.. فەوجی پاسەوانی شەرەفی تورکی تاسولوسی خۆیان‌دا بۆ پێشوازی کردن، فرۆکەخانەی ئەستەمۆڵ کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی «تورکیا» و حوکوومەتانی هاوبەشی پەیمانی بەغدا تێدایاکەوتنە جرت و فرت!.

ئەوە ئەوان لەوێ‌وا، لەم‌لاوە «نوری» و «عبدالاله» گەڕانەوە خۆیان ئامادە کرد کە رۆژی (١٤)ی تەمووز لە سەعات (٧)ی بەیانی‌دا بە فڕۆکە بفڕن و سەعات دەبگەنە لەستەمۆڵ، چونکە لەوێ لەو وەختەدا پێشوازی کەرالی حوکوومەتانی هاوبەشی پەیمانی بەغدا و فەوجی پاسەوانی شەرەفی شەقامی ئیستقلال چاوەڕێ مەوکبی ملووکانە

ئەکەن!.. مەوکبی ملووکانەش عبارەتە لە فیصل پادشای عێراق و لە عبدالاله ولیعهدی ئێستەی عێراق و شای پاشەرۆژی سووریا!. وەلە نووری سعید رەئیسی وزرای ـ بەکیەتی عێراق و أردن ـ و دەست و پێوەندی ئەمانە.

ئەمانە بەم جۆرە هەموو خۆیانیان ئامادە کرد و فڕۆکەخانەی بەغدا بە خۆی و بە فڕۆکەی پادشاهیەوە شەوی (١٤)ی تەمووز هەر لە خۆ، رێک خستنابوو لەگەڵ فەوجی پاسەوانی شاهی ـ دا، لەگەڵ وزرا و پیاوماقوولانی سەربەدەرەوە بوەکانی کۆشکی «رحاب». ئەمانە هەموو خۆیان ئامادە کرد بۆ ئەوە بەیانی سەعات (٧) «مەوکبی ملووکی» بەرێ کەوێ، وەکوو چۆن وزرا و پیاوەکانی [ناپلیون] لە پاریس ناپلیون ـیان بەرێ ئەکرد بۆ فەتحەکانی ئەڵەمانیا و نەمسەو رووسیا بۆ فەرەنسە ئەمانیش وابوون!!.. «تف باد بر چرخ گردون تف!!».

* * *

«نوری سعید» فەرمانی دەرکردبوو، کە لەشەوی (١٤)ی تەمووزدا لوای (١٩) بچێت بۆ [أردن] بۆ یاریەدانی وڵاتی أردن. فەرمانێکی ترکرایە سەر «عبدالکریم قاسم» کەچەک و جبەخانە و ئازۆخەیەکی تەواو بۆ ئەم لوایە وەربگرێ. مەرکەزی لواش لە «جەلەولا»یە، هیچ رێگەیەکی نیە بۆ [أردن] غەیری ناوشاری بەغدا نەبێ. وا دیاربوو «نوری سعید» بۆیە وتبووی بەشەو بڕۆن نەیەویست ئەم هێزە بەرۆژا بەناوشاری بەغدادا بڕواو خەڵکی لەبەر خۆیانەوە دەست بکەن بە قسەکردن، چونکە هەر لە بناغەدا شەعبی عێراقی دڵگران بوون لەم رێکەوتنەی بەینی عێراق و أردنە، جا لەبەر ئەمە قسەی زۆر لێ ئەبوورەوە.

[عبدالکریم قاسم] وەکوو لە پێشا زانیمان زۆر دەمێک بوو داخ لەدڵ بوو کەڵڵەی بۆ شۆڕشێک تەمی ئەکرد. لێرەدا کەوتە فیکرکردنەوە کە ئایا واز لەم باوەڕەی بێنێ ئێستە، یان هەڵیەتی و نایێ هەڵ لەدەست بدا؟. لەلایەکەوە فیکری ئەوەی ئەکردەوە. کە

«عبدالاله» و «نوری سعید» دەمێ ساڵە خەریکن و بە هەزاران وە بەڵکور بە ملیۆن ژێر دەستەو هەواخوایان لە سوپاو لە ئەهالی پەیداکردووەو ئەمیش هێزێکی وای نی‌یەکە چاری لەو هەموو پشتیوانانەی ئەوان بکا. کەچی هەر لە عەینی وەختیشا ئەهات بە دڵیاکە زۆر و ستەمی «عبدالاله» و «نوری سعید» لە ماوەی ئەم چەند ساڵانەی رابردوودا ئەوەندە زۆر بووە دڵی هەموو کەسێکی بریندار کردووە، ئەوانەی کەوا ئێستە ئەڵێن «سیدنا» و «پاشا» لەبەر ناچاریە وا ئەڵێن ئەگینا بێجگە لە هەندێ کاسەلێس بڕوا ناکرێ ئەم شەعبە پشتیوانیان بکەن.

ئەمە و شتێکی تریش، ئەوەش تا ئێستە لە تأریخی ئەم حوکومەتەدا رێ نەکەوتووە «فیصل» و «عبدالاله» و «نوری سعید» و دەستوپێوەندەکانیان لە شەوێکی وەکوو (١٤)ی تەمووزدا هەموو لە بەغدادابن و هەموو بەو جۆرە کۆببنەوە!. ئەگەر هیچ نیشانەی سەرکەوتن نەبێ کۆبوونەوەی ئەمانە هەموو نیشانەیەکە بۆ سەرکەوتنی شۆڕشە پیرۆزەکەی. پاش ئەم خەیاڵانە بڕیاریدا و وتی:

[سأمضي فما بالموت عار على الفتى    اذا ما نوى حقاً و جاهد مسلما
وواسى الرجال الصالحين بنفسه    وفارق مذموما و خالف مجرما
فأن عشت لم أذمم و لن مت لم ألم    كفى بك ذلا أن تعيش و ترغما]

هەر لە رۆژی [١٠ی تەمووزی ١٩٥٨]دا بڕیاری شۆڕشیدا و ئەفسەرە هەواخواکانی خۆی تێ‌گەیاند و هەموو تەرتیباتێکی بۆ دانان و ئەوی شایانی رێگە دانان و دەرزی سەر لەشکرێک بێ، هەمووی پێوتن. نە، عبدالکریم خۆی تێکدا، نە هەواخواکانی، بە، لەسەر خۆیی و بەبێ شڵەژان کاروباریان جێبەجێ ئەکرد. ئەگەر یەکێک لەغەیری ئەفسەرانی ئازاد شتێکی غەیرە اعتیادی لێوە ببینیایە ئەیانوت «سیدنا خەریکی سەفەری خێرە بۆ ئەستەمۆڵ، ئەبێ تەرتیبات بکەین بۆ ئەوا.». بەمە پێیەیان ئەکردا.

هەتا ئەم دەقیقەیە فەرمان لەلایەن سەرلەشکری گشتیەوە ـ عبدالکریم قـاسم ـ هـەر بەزمان بوو بۆ سەرئەفسەرانی ئازاد، لەوانیشەوە دیسان هەر بە زمان بوو بۆ سەرخواروتر، هیچی نەچووبووە سەر قاقەز، وەکوو لەبەرکردنی منالّی کەقەت لەبیرناچێتەوە ئەمانیش فەرمان و ڕێگەو شوێنی جەنگیەکەیان ئاوا لەبەر کردبوو.

لە پاش ئەوە هەرکە فرمانی خۆی زانی و بەڕێ کەوتن روو بـە بـەغدا، لەسـەعات [١١ی شەوی ١٣ی تەمووز]دا «عبدالکریم قاسم» و هاوڕێکانی ڕوویان کردە شوێنی قیادە لەوەزارەتی دفاع. ئەو ئەفسەرەی کە نۆبەتچی مەقەڕی قیادەبوو لەهەواخواکانی «عبدالکریم»بوو، بە هۆی ئەوەوە دایەرەکانی وەزارەتی دفاع شکێکیان بە هیچ نەبرد. لە «مقری قیادە» دانیشتن و لە سەعات (١٢)دا ئـەوشتانەکـە لـەبوا بکـرانـایە ئـەو شـەوە ئەفسەرەکانی ئەوێ فەرمانیان لە [عبدالکریم] وەرگرت و بەمەکینەی دەستی لەچاپیان‌دا و خێرا بەسەر لق و پۆپی لەشکرەکەی خۆیانا بلاّویان کردەوە.

ئەو ئیشانەی کە ئەوشەوە ئەبوایە بکرایە: گرتنی (قصر الرحاب، قصری نوری سعید، ئێستگەی إذاعە، دایەرەی تەلەفۆن و تەلگراف، بڕینی خەتی تەلەفۆن و تەلگراف لەماڵی عبدالالە و نوری سعید و وەزیرەکان، گرتنی هەموو وەزیر و هەواخواکانی «عبدالالە» و «نوری سعید»، گرتنی کۆشکی مۆدیریەتی پۆلیسی گشتی، گرتنی مۆدیرەکەی و سەرۆکی ئەرکانی سوپا. گرتنی پردەکانی ناوشاری بەغدا و ئەو شوێنانەکە مەترسی لێ ئەکرێ. وریابوون بۆ گرتنی هێزی پۆلیسی «سیار»). ئەمانە ئەبێ تا سەعات (٦)ی بەیانی هەموو بگیرێن بەبێ ئەوە یەکێک لەیەکێ بکەوێ وە هەرکەسە شوێنی ئیشی خۆی بۆدانرا. وە ئەمانە هەموو بە هۆی تەلسزەوە ئەبێ دەقیقە بەدەقیقە و هەنگاو بە هـەنگاو کـارەساتی خۆیان بە «عبدالکریم قاسم» بگەیەنن لە [وەزارەتـی دفـاع]، ئـەمیش بـە پـێ پـێشهات فەرمانیان بەسەرا بلاّوکاتەوە.

ئەم فەرمانانە جێ‌بەجێ کراو دەنگ نەکرا تا هەموو بارەگا و دیواخانێک خەوی لێ

کەوت و ئەوی لەرابواردنی شەوابووگەڕایەوە ماڵی خۆی، واتە بوو بە سەعات سێ پاش نیوەشەو، دنیای بەغدا پەردەی خامۆشی بەنەواوی بەسەرخۆیاکێشا بۆ ئەوە لە پاش سێ سەعاتیتر پەردەیەکی شۆڕش پیشان بدا!.

بەرە بەرە دەستەکان هەرکە چوون بە شوێن ئیشی خۆیانەوە. هیچ دەنگێک نەبوو تەنها دەنگی چەک و رۆیشتنی سەربازانی ئازا نەبێ بۆ رزگار کردنی ولات لە دیلیەتی چەندساڵە!. ئەوانەی تەلەفۆن برینیان پێ سپێرابوو ئیشی خۆیانیان کرد، ئەوانەی گرتنی دایەرەی تەلەفۆن و تەلگرافیان پێ سپێرابوو ئیشی خۆیانیان کرد، رێگەکان و پردەکان گیرا، ئابلۆقەی ئەو ماڵانە ـ کە ئەبێ خاوەنەکانیان بگیرێن ـ درا. بەڵام ئەمانە هەموو بە بێدەنگی چونکە ئیشی هەرەزل ماوە؛ کۆشکی رحاب و نوری سعید و ئێستگەماوە.

دەستەکانی ئەو شوێنانەش بەرێ کەوتن، لە سەعات (٤)دا ئابلۆقەی کۆشکی عبدالاله «قصر الرحاب» درا، بڕیار وابوو «عبدالاله» و «فیصل» بگیرێن، [فەوجی حەرەس] بە هەموو چەکێکەوە لە «قصرالرحاب» دابوو، ئامری فەوج [طه بامەڕنی] بوو. دیارە کە ئەمانە پەلامار ئەدەن دەرکەوان و نۆبەتچی نایەڵن. ئەمان داوای ئامر فەوج ئەکەن، لە ئاخرا ئامریان دەست ئەکەوێ و پێ ئەڵێن شۆڕش بووە و ئەبێ «عبدالاله» و «فیصل» هەردووکیان لە تەختی پادشایی بێنەخوارەوە و تۆ ئەم فەرمانەیان پێ بگەیەنە. «ئامری فەوج» کە چاک ورد ئەبێتەوە سەیر ئەکا چوار دەوری کۆشک گیراوە!. ئەچێ «عبدالاله» لەخەو هەڵئەستێنێ و پێ ئەڵێ. عبدالاله لەم قسەیە تووڕە ئەبێ و پێ ئەڵێ بچۆ بەرەنگاریان بن تا هەواخواکانی ئێمە ئەگەن. کە دەست ئەدەنە تەلەفۆن و شتە سەیر ئەکەن هەمووی براوە. ئامر ئەگەڕێتەوە و ئەیەوێ فەوجەکەی خۆی بخانە شەڕەوە، پاشان دەستەی شۆڕش تێ ئەگەیەنن کە بەرانبەری کردن کەڵکی نیە و واز لەخۆی بێنێ، ئامر لە فیکرەی خۆی پەشیمان ئەبێتەوەو شۆڕشگێرەکان ئەچنە ژوورەوە. لە سەعات (٥/٤٥) دەقیقەدا قاپی پشتی کۆشک ـ کە بەرەڵابوو ـ [عبدالله سعید] بە خۆی و تۆپەکانیەوە

لەویش ئەو قاپیە ئەگرێ.

سەیر ئەکەن «عبدالالە» و ئەو دەستو پێوەندەکە لەوێن بە [مەترەلۆز] ئەکەونە تەقە، لە، شۆڕش گێڕەکان، ئەمان هەر کۆششی ئەوە ئەکەن کە بەڵکو فیصل تەخت بداتە دواوە. ئەمە سەرناگرێ ئەمجا «قصرالرحاب» ئەدەنە بەرتۆپ، ئەفسەر «مصطفی عبدالله» و «عبدالستار» ئەچنە ژوورەوە. گۆیا «فیصل» ویستوویەتی چی شۆڕش گێڕەکان ئەیڵێن ئەو وا بکا، عبدالالە کوشتوویەتی، وەهەر بە گوللەی عبدالالە و خزمەتچیەکان چەند ئەفسەر و سەربازێکی شۆڕش گێڕەکان بە کوژراوی وبریندازی ئەکەون. کە ئێش ئەگاتە ئەم شوێنە ئەمانیش مەترەلۆزیان تێ ئەگرن و ئەوان ئەکوژن. پاشان لەناو کوژراوەکانی «قصرالرحاب»دا لەشی دوو ئافرەتی تیاترۆی فەرەنسی و ئینگلیزیش ئەبینرێتەوە!. تا ئەمانە کرا سەعات بوو بە شەش بەڵام تەقەی «قصرالرحاب» هەر ئەهات.

ئەو دەستەیەکە روویان کردە ئێستگەو ئەفسەرەکەیان لە ئازدەکان بوو بە جۆرێکی ئاسانی ئێستگەیان گرت و لە سەعات (٦)دا «عبدالسلام» چووەسەر ئێستگەو وتی: «ئێرە کۆماری عێراقە» و هانی شەعبی‌داکە بچن بۆ [قصر الرحاب] لاشەی کوژراوی «عبدالالە» ببینن کە ساڵەهای ساڵە بۆی تینوون!.

ئەوانەی کە روویان کردە کۆشکی «نوری سعید»، کۆشکیان دایە بەرگوللە، لەگەڵ ئەو هەموو پاسەوانە کە تێدابوو چوونە ژوورەوە، کە ئەچن نووری دیار نیە. بەمە زۆر شڵەژان. تومەز نووری کە ئەزانێ وایەو دەست ئەداتە تەلەفۆن ئەویش براوە، تێ ئەگاکە ئەمە شۆڕشە و رۆژەکەیەکە جار جار فیکری لێ ئەکردەوە!. کۆشکەکەی لەسەر رووباری دجلەبوو، بە پەلە پڕۆزێ و بەجلی شەوەوە ئەچێتە رووبارەکەو بە هۆی «بەلەم»چیەکەوە دەرباز ئەبێ و رووئەکاتە «کازمەین» و شەوێک لەوێدا ئەمێنێتەوەو پاشان ئەگەڕێتەوە بۆ بەغدا بۆ «کەڕادە» و رۆژی دوایی ئەگیرێت و پارچە پارچە ئەکرێت!.

کە لەو سێ شوێنە گیرا «قوەی سیارەی پۆلیس کە لە «صالحیە» بوو بەچەند سەربازێکی کەم ئەگیرێت و وردە وردە شوێنە کانی تریش ئەگیرێن.

ئیشی هەرە زل ئیستگەی رادیو کردی! کە بلاوی کردەوە شۆرش بووەو «عبدالالە» کوژراوە و ولات بووە بە جمهووریەت. لەمە ئەو نەیرووە کە ئاگایان لە هیچ نەبوو هەواخوای بنەمالەی شاهی بوون هەموو شلەژان و وتیان مادام دەورو دووکان تیکچووە دیارە لەمە هێزێکی زل هەیە ئیمە بەرانبەری‌مان پێ ناکرێ، خۆیان دا بە دەستەوە. مەسەلێکی کوردی هەیە ئەلێ: «ئەوی خاوەن مال ئەیزانێ ئەگەر دز بیزانی هیچ لە مالا نایەلێ!». هێزە کانی تر لە گەر ئەیانزانی هێزی شۆرش گێرە کان لە چاو هێزی ئەوانا ئەوەندە کەمە نەیانئەهێشت کە شۆرش سەربگرێ. بەلام ئەبوا ئەوەشیان بزانیایە کە هێزی شۆرش گێرە کان هێزێکی خوایی بوو. خوا ئەیەویست بە شۆرشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی «عبدالکریم قاسم» لە عێراقا دوایی بەپەردەی زولم و جەوری ئەو زالمانە بێنێ، کە هەموو چارەنووسێکی ئەم شەعبە ـ یان بەلاوە لە هیچ کەمتر بوو...

هەر لە گەل ئەمانەدا وەزیرە کان و ئەفسەرە گەورە کان ـ کە سەر بەدەوری پێشوو بوون ـ لە گەل گەلێ کەسی‌ترا گیران و نەهێلران هەنگاو بنێنە بەر هەنگاوا. «نوری سعید» کە (٢٧) سال (٨٠) هەزار جاسووسی بەخێو کرد نەیانتوانی کنەیەک، سەرەدەزوێک لەشۆرشە پیرۆزەکەی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق بکەن و بدۆزنەوە! و نەیانتوانی لە تۆزێ لەناودلی [عبدالکریم قاسم] بگەن!.

کەوابوو ئەو شۆرشە هێمنە کە لاپەرەی ئاسمانی رۆژهەلاتی ناوەراست و خوارووی گۆری و بوو بە عنوانێکی هەرەزل لە لاپەرەی تأریخی شۆرشە کانی عالەما شۆرشێک بوو کە لە ماوەی ـ ئەگەر راستیت ئەوێ ـ سێ سەعاتا لە [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨] لە عێراقا بەسەرکردەیی «عبدالکریم قاسم» روویدا و هیچی‌ترا.

لە سەعات [١٠ی رۆژی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨] لە عێراقا شاری شۆرش بوو،

کەچی لە شاری ئەستەمۆڵدا کە بەتەمای «مەوکیبی ملوکی» عێراق بوون بگاتە ئەوێ!. ـ شەقامی ئیستقلال ـ ئالاکانی تێکدا و خەبەری مانەمی بردەوە بۆ بارەگاکانی «تورکیا و ئێران و پاکستان و ئینگلیز و ئەمەریکا!!».

* * *

لە سەعات (٧)ی بەیانی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨] لە ئێستگەی یێ‌تەلی بەغدادا بلاو کرایەوە کە دەوری ملوکیەت و پادشایەتی ـ ئەو ملوکیەتە، کە لە سەعات (٧)ی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی [١٣ی تەمووزی ١٩٥٨]دا بە خەیاڵیانا نەئەهات کە هێزێک لەعالەما هەبێ تا هەزار ساڵی‌تر بتوانێ لایبەرێ ـ لە عێراقا بەسەرچوو حوکومەتی عێراق بوو بە حوکومەتێکی «کۆماری ـ جمهوری». تاکەوتە سەعات هەشتی ڕۆژی (١٤) دیواخانێک بە فەرمانی [قائدی گشتی قواتی مسلحە] دانراو ناونرایە «مجلسی سیادە» و ئەندامەکانی عبارەت بوون لە: ـ

(١) فەریق رکن نجیب ربیعی ـ سەرۆک. (٢) محمد مهدی کبە ـ ئەندام. (٣) خالد نقشبندی ـ ئەندام.

هەر لەوکاتەدا ئێستگە بە فەرمانی [مجلسی سیادە] بلاوی کردەوە کە دیوانی وزرای کۆماری دانراو ئەندامەکانی عبارەت بوون لە: ـ

[عبدالکریم قاسم رەئیسی وزراو وەکیلی وەزیری دفاع. ئەمە بێجگە لەوەکە قائدی قواتی عامی مسلحەیە، عبدالسلام محمد عارف نائب رەئیسی وزرا و وەکیلی وزیری داخلە. محمد حدید وزیری مالیە. عبدالجبار جومرد وزیری خارجیە. مصطفی عەلی وزیری عدلیە. ابراهیم کبە وزیری اقتصاد. جابر عمر وزیری معارف. زعیم رکن ناجی طالب وزیری شؤونی اجتماعی. بابەعەلی شێخ مەحمود وزیری ئەشغال و مواصلات. محمدصالح محمود وزیری صحە. هدیب حاجی محمود وزیری زراعە. فؤاد رکابی وزیری اعمار. صدیق شنشل وزیری لرشاد].

لە رۆژی [٢٧ی تەمووزی ١٩٥٨]دا «مجلسی سیادە» و «مجلسی وزرا» کۆبوونەوە و «دەستووری وەختی ـ موقت»یان دانا بۆ کۆماری عێراقی و بەم دەستوورە قانوونی ئەساسی عێراقی کە لە (١٩٢٠)داکرابوو حوکمی لابراو ئەم دەستوورە نیشتە شوێنی ئەو. دەستووری وەختی عبارەت بوو لە (٤) باب و لە (٣٠) بەند. بابی یەکەم کۆماری عێراق. بابی دووهەم سەرچاوەی حوکم و حقووقی گشتی. بابی سێ‌یەم یاسای حوکم. بابی چوارەم ئەحکامی انتقالی.

بەرە بەرە کۆماری عێراق کەوتە قایم کردنەوەی ئاشنایەتی خۆی و حوکوومەتەکانی گێتی، کەوتە دامەزراندن و دروستکردنی کاروباری ناوەوە. کەوتە دیوانێکی بەرزی عەسکەری لە ژێر سەرۆکی «عقید فاضل عباس مهداوی» بۆ موحاکمە کردنی پیاوانی سیاسی دەوری پێشوو. کەوتە بەرەلاکردنی حەپسە سیاسیەکانی دەوری پێشوو. ئەمانەش کە هەر شتێک ئەکرا لە ژێر فەرمانی پێشەوای شۆرش [عبدالکریم قاسم]دا ئەکرا.

وەکوو بارانی بەهار تەلگرافی حوکوومەتەکانی دنیا ئەباری بە سەر «عبدالکریم قاسم»داو پشتیوانی و رەزامەندیان پیشان ئەدا بەرانبەر بەم کۆمارە تازەی عێراق ـ ە. هەروەها لە ناوەوەی عێراقەوە، لە شیمال و جنووبەوە تەلگراف و شەعب لە لایەن هەموو دەستەیەکەوە رووی ئەکردە بەغدا وە وفدەکان ئەچوون بۆلای [عبدالکریم] و پێ‌خۆشبوون و رەزامەندی خۆیان بەرانبەر بە بزووتنەوەکەی و بە کۆماری تازە پیشان ئەدا.

بەم جۆرە و لەسەر ئەم وێنەیە بە هۆی کۆششی عبدالکریم قاسم ـ ەوە شۆرشی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨)ی عێراق دەزگاو دووکانی پادشایەتی پێچایەوەو عێراق بوو بە حوکوومەتێکی کۆماری و دەنگی بە هەموو عالەمی رۆژهەلات و رۆژئاوادا بلاوبووەوە.

* * *

زۆر لە مێژە کورد و عەرەب پێکەوە لەم وڵاتەدا ئەژین و شان بە شانی یەک لە هەموو شتێکدا هاتوونەتە خوارەوە، لە دەورەکانی عەباسی‌دا پێکەوە کاروباری ـ ئەوی پێیان کرابێ ـ بنەماڵەی [عەباسی]یان هەڵسووڕاندووە، لە رۆژەکانی عوسمانی‌دا لە شایی و شینی ئەو دەوڵەتەدا هاوبەش بوون، لە زەمانی حوکوومەتی پێشوودا هەردووکیان لە ژێر یەک جەورا ـ بە دەست پیاوەکانیانەوە ـ تلاونەتەوە. ئەو دەورانەو ئەو بنەماڵانە هەموو رۆیشتن و کورد و عەرەب هەر مانەوە!. لەم تأرێخانەدا ئەوی، زۆر تێدایا هاوبەش بوویێتن چەوساندنەوە و پەریشانی بووە، بەراستی لەم رووەوە وەکوو یەک شانیان دابووە بەری و ئەرکێکی زلیان هەڵگرتبوو. دیارە هەموو شتێک دوایی هاتنێکی هەیە.

بە تایبەتی لەدەوری پێشوودا شتێکیان دانابوو ناویان نابوو [قانوونی ئەساسی]. ئەم قانوونی ئەساسیە لەمەرەکەبەکە بەولاوە ـ کە کەوتبووە سەر قافەزەکە ـ هیچ نموودێکی‌تری نەبووا. ئەمجا هاتبوون لەسەر ئەمە قەوانین و یاسای‌تریان دروست کردبوو. راستە ئەمانە ئیشیان پێ ئەکرا بەڵام بەرانبەر بەکێ و بەسەرکێ‌دا ئەتوێنرانەوە؟. بەسەر پیاوی هەژار و بێ‌دەسەڵات و کەساسا!. بەسەر ئەوانەدا کە ئەگەر خوانەکردە قسەیەکی راستیان بەرانبەر بە خاوەن حوکمێک بکردایە خێرا بەداری قانوونەوە لێ ئەهاتنە دەست و ئەیانوت، لەم قسەی تۆیە پێچەوانەی قانوونە و قانوون وا نافەرمووێ!. بەداری ئەوقانوونە ـ کە خۆیان ئەیانفەرموا ـ پشتی کابرایان ئەشکاند و دایان ئەڕزاند!.

بەڵام خاوەن حوکمەکان و خاوەن دەسەڵاتەکان ئەوان خۆیان لەژوور قانوونەوەبوون؛ خەڵکیان رووت بکردایەتەوە، ماڵیانیان زەوت بکردایە، حەپسیان بکردنایە، بەرتیلیان لێ وەربگرتنایە هیچ قانوونێک نەبوو، کە محاسبەی ئەوان بکا، چونکە ئەوان لە ژوور قانوونەوەن!. قانوون ئەیفەرموو فلانە بەگ، وە یا فلانە شێخ، وە یا فلان وەزیر ئەفەنی! ئەوەندە و ئەوەندە هەزار دیناری ماڵی ،زەریبە،ی کەوتۆتە لا، لەبەر ئەوەکە ئەم جۆرە قەرزانە لەو قەرزانەن، کە دەست ناکەونەوە بڕیاری دا ـ واتە قانوون ـ

قەڵەمی لێ خۆشبوونی بەسەرا بکێشرێ!. لەوەختێکا کە کابرای بەقاڵ وە یا کابرای تۆڕفرۆش لەبەر ئەوەکەوا نیو دینار «زەریبە»ی لەسەرە بە فەرموودەی قانوون حوکم دراو حەپس کرا!!...

ئەمە نموونەیەک بوو لە لقوپۆپەکانی «قانونی ئەساسی» دەوری پێشووکەکوردێک و عەرەبێک وەکوو یەک وابوون تیا!.

لەنەتیجەی ئەو زوڵم و زۆرەبووکە پاڵەوانی نەترسی شۆڕش «عبدالکریم قاسم» شۆڕشە بەناوبانگەکەی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراقی گێڕا و ئەو دەورو دووکانەی تێکدا و سەرەولێژی کردەوە.

[عبدالکریم قاسم] ئەم ئیشەی کرد، هەموو شەعب پشتیوانیان کرد، لەم ئیشە پیرۆزەی کرد بە هۆی پشتیوانی کردنی شەعبی عێراقیەوە، بەهۆی کوردی عێراقەوە، بە هۆی عەرەبی عێراقەوە. وەکوو پێشەوای شۆڕش گیانی خۆی خستە سەردەستی، لەفسەرانی کورد و عەرەب و سەربازانی کورد و عەرەب و شەعبی عەرەب و کوردی عێراق ـ یش گیانیان خستە سەردەستیان بۆ فداکاریە پیرۆزەکەی عبدالکریم، بۆ عبدالکریم!.

[عبدالکریم قاسم] عێراقی لە دیلیەتی رزگار کرد، شەعبی عێراق ئەمەیان لە فیکر ناچێتەوە، وەکوو ئەویش شەعبی عێراقی لە فیکر ناچێتەوە. شۆڕشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق دنیای ئیمرۆژ و دنیای پاشەرۆژ تەنها لە «عبدالکریم قاسم»ی ئەناسی و لەشەعبی عێراقی؛ ئەو شەعبەکە عبدالکریم و ئەفسەرە ئازاکانی و سەربازە نەترسەکانی هەموو لەو شەعبەن. تەنها ئەمان کردنیان کەسی تر نەیکرد.

ـ کورد و عەرەب ـ لە عێراقا وەکوو لەدەورو پڕ جەور و ستەمەکانی پێشوا شان بە شانی یەک رۆیشتوون، لەم دەوری کامەرانی و ئازادیەشا هەر ئەڕۆن و ئەبن بە پەروانەی دەوری [عبدالکریم قاسم]. کورد تا ئەم رۆژە هیچ درێغیەکی لە [عبدالکریم قاسم] و لە

قایم کردنەوەی کۆماری عێراق نەکردووە لەم ڕۆژەش بەدواوە نایکا چونکە ئەم خاکەو ئەم کۆمارە بەهی خۆی ئەزانێ، بۆیە درێغی ناکاو بەهی خۆی ئەزانێ چونکە بەندی (٣) لەبابی یەکەمی دستوورە کاتیەکەی کۆماری عێراق ئەڵێ: ـ

«کەیانی عێراقی لەسەر ئەساسی یارمەتی‌دانی هەموو دانیشتوەکانی دائەمەزرێ، ئەمەش بەوەکە احترامی حقووقیان بگیرێت و ئازادی‌یان بپارێزرێت. عەرەب و کورد هاوبەشن لەم نیشتمانەدا. ئەم دەستوورە لە ناو یەکیەتی عێراقی‌دا دان بە هەموو حقووقێکی کورددا ئەنێ..!».

ئەم بەندە لە دەستووری وەختی کۆماری عێراقاگەلێ جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو بەندانەداکە لە «قانونی ئەساسی» عێراقی پێشوودا هەبوو. بەندەکانی ئەوێ حوکمەکەی «أرستقراتی» بوو؛ واتە چەندکەسێک مەفهوومی ئەو بەندانەیان ئەکرد بەمەو بەو هۆیەوە کورسیەکانی وەزارەتیان دائەگرت، ئەمجا بە خۆیان و بە «حوکم» دانەرەوە شەعبەکەیان ئەپلیشاندەوە!. ئەگەر یەکێکیش بیوتایەکوا مەفهوومەکانی قانوونی ئەساسی بەرانبەر بە کورد؟. خێرا پێ ئەوترا: «کوردە! چیت ئەوێ؟. قانوونی ئەساسی وەزیر و نائبی داوینێ. ئەوا وەزیر و نائبت هەیە داوای حقووقت بۆ ئەکەن!.».

ئەمەیان پێ ئەوت و ڕاست بوو وەزیر و نائبیش هەبوو، بەڵام جارێ بێجگە لەوەکە حقووقەکە هەر ئەوەندەبووکە وەزیر و نائبە ـ زۆرتر زڕەکوردەکانی پێ‌بین بە وەزیر و نائب ـ بۆ خزمەت کردنی گیرفانی خۆیان و ئاغاکانیان!. بێجگە لەمە وەزیر و نائبەکان لە کۆشکە بەرز و ڕەنگاو ڕەنگەکانی خۆیانا بە جۆرێ بە چوار مەشقی دانیشتبوون هیچ گەورە و بچووکێکی شەعب ـ ئەگەر دووربینیشیان بەدەستەوە بوایە ـ هەر بەرچاویان نەئەکەوتن. وەکوو ئەمان ئەوانیان بەرچاو نەئەکەوت ئەوانیش بێزیان نەئەهات سەیرێکی ئەمان بکەن!.

ئەمە بوو مەفهوومی «قانونی ئەساسی» دەوری پێشووی عێراق بەرانبەر بە کورد.

بەلاّم دەستووری كۆماری عێراقی ئیمڕۆ ئەو قانوونەی پێشووی سەرەولێژ كردەوە و بەهەموو ئاشكراییەك حەقی بە هەموو تاقەكوردێك داوە، هەموو كوردێكی گەورە و بچووك وەكوو یەك تیایا شەریكن، وەكوو هەموو عەرەب و كوردێكی عێراق لە نیشتمانەكەدا هاوبەشن. كەوابوو راست بوو جیاییەكی زۆر هەبوو لەبەینی «قانوونی ئەساسی» دەوری پێشووی عێراق و لەبەینی دەستووری وەختی كۆماری خۆشەویستی عێراقی ئێستەدا.

لەبەر ئەمانە و لەبەر خۆشەویستی زاتی [عبدالكريم قاسم] لەبەر چاوی هەموو تاقەكەسێكی ئەم نیشتمانە لەباوەڕی منا ـ وەلام وایە لەواقعیشا هەر وایە ـ كورد تا ئاخر هەناسەی بە هەموو هێزێكیەوە پشتیوانی و تأییدی كۆماری عێراق و [عبدالكريم قاسم] سەرۆكی شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی عێراق ئەكاو بۆ بەرزبوونەوە و پێشكەوتنیان بەماڵ و بەگیان ئامادەی هەموو فیداكاریەك ئەبن.

* * *

لێرەدا دووشت هەیە لام وایە پێویستە بە باسكردن:

یەكەم ـ وەكوو پێویستە لەسەر هەموو تاقەكەسێكی كورد پشتیوانی ئەم كۆماری عێراقە بكا، بەو جۆرەش پێویستە لەسەر هەموو تاقەكەسێكی عەرەب لە عێراقا تا ئاخر هەناسەی پشتیوانی بكاو شان بە شانی یەك ئەم دوو شەعبە تەكان بدەن بۆ بەرزكردنەوە و قایم كردنی ئەم كۆمارە تازەی خۆشەویستەی عێراق. بە تایبەتی ئەوانەی كەوا بە درێژایی عومری درێژی كۆماری خۆشەویست ئەكەونە سەر كورسی حوكم و حوكم ئەگرن بە دەستەوە ـ چەكوردێك بێ وە یا عەرەبێك بێ ـ ئەبێ بە بێ جیاوازی، داد و عەدڵ لە بەینی شەعبا بەجێ بێنن، لەبێ «نصە»كانی دەستووری كۆمار نەخەنە پشت گوێ بەرانبەر بە هەندێك و بەرانبەر بە هەندێكی تریش «تطبیقی» بكەن. ئەگەر ئەمە بكەن خیانەتێكە لە «شەعب» و لە كۆماری ئەكەن.

ئەو دەورە کەئەو پیاوانە ئەدۆزێتەوە بۆ «حوکم» دەورەیەکی شەعبی و یەکیەتیە، نەوەک دەورەیەکی «أرستقراتی» و جیایی. شەعب ئیشی ئەوێ نەوەک قسە، یەکیەتی ئەوێ نەوەک جیایی، برایەتی ئەوێ نەوەک دوژمنایەتی، هێمنی و ئاشتی ئەوێ نەوەک ئاژاوەو شەڕ. پیاوەکانی دەوری پێشوو هەموو پێچەوانەکانیان گرتبوو بۆیە ئاشنایەتی لەبەینی ئەوان و شەعبا بچڕابوو.

دووهەم ـ ئەم عێراقە سەرمایەیەکی زۆری هەیە، نەوتێکی زۆری هەیە هەمووکەس تەماعی تێ ئەکاو چاوی تێ ئەبڕێ، خوێندەواری و سەقافەتێکی وای نیە، کەبتوانێ بەو هۆیەوە بەربەرەکانێ ئەو چاوبڕکێتیە بکا، ئەبێ لە پێشا کۆشش بکرێ بۆ پێ گەیاندن و بەرز بوونەوەی پایەی خوێندەواری و ئابووری و پیشەسازی [شەعب]ەکە، پاش ئەوە ئەگەر یەکێکی‌تریش چاوی تێ‌بڕی ئەم ئەتوانێ تاکی تەرازووی خۆی راست بکاتەوە.

قەومی کورد ـ وەکوو وترا ـ لە هەموو ئەدوارو پلەکانا بەگیان و بە ماڵ و بەدڵ پشتیوانی و تأییدی ئەم کۆماری عێراقەی کردووەو ئەیکا، تا نیوە هەناسەیەکی تێدا بمێنێ هەر ئەیکا و دوا ناکەوێ، بۆیەش دوا ناکەوێ و ئەیکا چونکە قازانجی لەمەدایە و هەرکە قازانجی خۆی ئەوێ. وەبێ گومان قازانجی عەرەبەکانیش ـ ئەو عەرەبانە کە بۆ دروستکردنی ئەم کۆمارە جەنگیون و ئەرکی دامەزراندن و راگرتنی کۆمار کەوتۆتە سەرشانی هەموو تاقەکەسێکیان ـ هەر لەمەدایە، قازانجیان هەر لەوەدایە چۆن پێکەوە قۆڵیان کرد بە قۆڵی یەکا بۆ قایم کردن و دامەزراندنی کۆمار هەر بەو جۆرەش بمێننەوەو ئاور بەلایەکی‌ترەوە نەدەنەوە.

ئەوانەی کەوا بە پڕوپاگاندە جۆرە شتێکی‌تر ئەهێننە ناوەوەو گوێ لە دەنگی تەموورەی هەندێ لە دوژمنەکانی عێراق ئەگرن، ئەوانە وەنەبێ دۆستایەتی بکەن لەگەڵ عێراقا وُ لەگەڵ عەرەبی عێراقا.

پەردەکانی رابردووی [عبدالکریم قاسم] دەری ئەخاکە ئەم پیاوە بەرانبەر بەم ئاور و

خاک و خەڵکە دڵسۆزە و خۆشی و کامەرانی ئەم میللەتەی ئەوێ، ئەیەوێ عێراق بۆ عێراق بێت و دەستێکی تر لەناویا نەبێ، پێچەوانەی ئەو باوەڕەی ئەو، بێ گومان زیان بە عەرەبەکان زیاتر ئەگەیەنێ لە عێراقا تاکوردەکان. چونکە کوردەکان پشتیوانی بیروباوەڕی عبدالکریم قاسم تا ئاخر تنۆکی خوێنی ژیانیان ئەکەن و ئەم ـ جمهووریەتی عێراقیە ـ ئەپارێزن،گومانی تێدا نیە ئەوی پێچەوانەی ئەم باوەڕەی هەبێ بروا ناکرێ تیایا سەرکەوێ.

خۆ ئەگەر لە بیروباوەڕێکی راستا بیانەوێ هاوکاری لەگەڵ کوردەکانا بکەن، ئەوە کورد تا تنۆکی خوێنی تێدا بمێنێ قۆڵی لە قۆڵیا نایەو هەنگاو بە هەنگاو پێکەوە ئەچن بەرێدا و بە هێزی هەر دوولایانەوە ئەوەندەی تر کۆماری خۆشەویستی عێراق ئەگەیەننە چڵەپۆپەی بەرزیەتی و هیچ دەستێکی گزی کەری دەرەوەی «عێراق» ناتوانێ پەنجە بخاتە ناویانەوە.

[بۆ دانانی ئەم کتێبە سەیری ئەم سەرچاوانەی خوارەوەش کراوە:]


١ـ شرفنامە — شرفخانی بتلیسی

٢ـ تاریخ مردوخ — آیت‌الله کردستانی

٣ـ تاریخ أردلان — ناصر آزادپور

۴ـ اسرار بارزان — دکتر اسماعیل اردلان

۵ـ خلاصە کرد و کردستان — محمدامین زکی

٦ـ مشاهیر الکرد — محمد امین زکی

٧ـ امارة بهدینان — صدیق الدملوجی

٨ـ تاریخ الوزارات العێراقیة — سید عبدالرزاق الحسنی

٩ـ الضحایا الثلاث — عبدالمنعم الغلامی

١٠ـ القضیة الکردیة — دکتر بلەچ. شێرکۆ

١١ـ بارزان المظلومة — معروف جیاوگ

١٢ـ یادداشت — ماموستا رفیق حامی

١٣ـ مێژووی ئەدەبی کوردی — علاءالدین سجادی

١۴ـ هەڵکەوتێکی دێری — حسین حوزنی موکریانی

١۵ـ مەسەلەی کوردەکان و.جی.ایلفنستن.وەرگێڕی [عبدالقادر حشمت].

١٦ـ ازمهاباد خونین — نجفقلی پسیان.

١٧ـ مرگ بود و بازگشت هم بود — نجفقلی پسیان.

١٨ـ یادداشتی دەستنووس لە بارەی سابلاّخەوە... — عبدالرحمان زەبیحی.

١٩ـ گۆڤاری گەلاوێژ.

٢٠ـ الخرائط والمساحات العێراقیة

٢١ـ ئەو شۆڕشانەی کە لە بارەی عێراقەوە دەرچوون

٢٢ـ رۆژنامە کوردی ـ یەکان

**(ناواخن)**



* * *

## ستوونی ڕاست و چەوت

| لاپەڕە | دێڕ | چەوت | ڕاست |
| --- | --- | --- | --- |
| ٧ | ١٢ | کەم کورتە | کەم و کورتە |
| ١٥ | ١٣ | ئەیەیە | نەیەیە |
| ٢١ | ٧ | میسریەکار | میسریەکان |
| ٢٣ | ٢١ | ١٩٣٣ | ١٩٢٣ |
| ٢٩ | ٩ | لەبەر لەبەد | لەبەر بەد |
| ٤٠ | ٤ | جەبەر | جەبر |
| ٤١ | ٢٢ | کەوتبێنە | کەوتبێتنە |
| ٥١ | ١٤ | کۆڕانی | کوڕانی |
| ٥٣ | ٢ | داڵدری | داڵدەی |
| ٦١ | ١ | دەرکروە | دەرکردوە |
| ٧٢ | ٨ | جوانڕووە | جوانڕووە |
| ٧٨ | | ژێرویێنەکەی شێخ مەحموود١٩٥٧ | ١٩٥٦ |
| ٧٩ | ٢٣ | لە دنواخانەکانی | لە دیواخانەکانی |
| ٨٨ | ٥ | بەم جۆر | بەم جۆرە |
| ٨٨ | ٢٤ | ١٨٠٩ | ١٩٠٨ |
| ١١٤ | ٦ | بەمەزبەتە | مەزبەتە |
| ١١٨ | ١٩ | لایەکەو | لایەکەوە |
| ١٢٢ | ٢٢ | ئەیکەن | ئەکەن |
| ١٢٨ | ٢٤ | سیاسیەکانا | سیاسیەکانی |
| ١٣٠ | ٥ | کوردەکان | کوردەکانە |
| ١٣٤ | ٢ | دەرمانی | دەرمان |
| ١٣٧ | ٤ | ئەفیەندی | ئەفەندی |
| ١٤٢ | ١٠ | متصرفی | متصرف |
| ١٦٢ | ١٢ | پاریس و | پاریس و لە |
| ١٨٥ | ١٤ | نەکرری | ناکرری |
| ١٨٩ | ١٢ | هەبێ | هەیێ |

| لاپەڕە | دێڕ | چەوت | ڕاست |
|---|---|---|---|
| ٢٠٨ | ١٣ | گێڕایابە | گێڕایە |
| ٢١٧ | ٢٢ | بەرزانیەکانی | بەرزانیەکان |
| ٢١٩ | ١٣ | ئەم | ئەمە |
| ٢٢٤ | ١٧ | ئێرانیەکانی | ئێرانیەکان |
| ٢٢٨ | ١٨ | برس | برسی |
| ٢٣٥ | ٢ | بۆ حکومەت | بۆ ئەوە حکومەت |
| ٢٦٩ | ١٩ | لە ناچوونی | لەنارچوونی |
| ٢٨٩ | ١١ | لەسەردار | لەسەردرا |
| ٣٠٤ | ١٣ | لەقسانەی | ئەم قسانەی |
| ٣٢٣ | ١ | ئەمەیان | ئەمەمان |

ستوونی ڕاست و چەوت نووسینی مامۆستای هێژا سەجادی لە لاپەڕەکانی چاپی تازەدا اصلاح کراوە.

# ئەحمەد موحەممەدی لە چەن دێڕێکدا

ئەحمەدی موحەممەدی کوڕی قادر کوڕی میرزا موحەممەد، کوڕی میرزا شایی جان، خەڵکی دزڵی سەربەناوچەی هەورامان، نیشتەجێی شاری سنە، ساڵی ١٩٣٨ لە دزڵی هەورامان لە دایک بووە، خوێندنی سەرەتایی لە مەریوان و دەورەی ناوەندی لە کرماشان تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٦٠دا لە جەیشی ئێران دامەزراوە وە لە روتبەی رەئیس العورفیا تا ملازم یەکەم تەرفیعی کردووە.

لە دوای ٣٠ ساڵ دەوام لە ساڵی ١٩٨٠دا تقاعد و خانەنشین کراوە، لە دوای ئەوە دەستی داوەتە نووسین و کاری وەرگێڕی وەتا ئێستە توانیویە ٢١ بابەتی کوردی لە بارەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد لە زمانی کوردیەوە وەرگێڕێتە سەر زمانی فارسی، پێویستە ئاماژە بکرێ بەوەی کە ئەحمەد موحەممەدی ٩ بابەت لەو کتێبانەی بە ناوی بلاوکەر ـ وەرگێڕ لە سەر ئەرکی خۆی لە چاپی داون و بلاو بوونەتەوە.

## بەرهەمەکانم

ئەو بەرهەمانەی کە لە زمانی کوردیەوە وەرم گێراوەتە سەر زمانی فارسی و توانیم لە سەر مەسرەفی خۆم لە چاپیان بدەم و بلاویان کەمەوە ئەمانەن:

١ـ بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە تا ناوەراستی چەرخی بیست، نووسینی رەمزی قەزاز، چاپخانەی ژین ـ سلێمانی ١٩٧١.

٢ـ خەباتی گەلی کورد لە یادداشتەکانی «ئەحمەد تەقی»دا ـ لاپەرەیەک لە شۆرشەکانی شێخ مەحموود و سمکۆ و هەستانەکەی رەواندز، رێک خستن و ئامادەکردنی بۆ چاپ جەلال تەقی چاپخانەی سلمان (الاعظمی) بغداد.

٣ـ چیم دی = شۆرشەکانی شێخ مەحموودی مەزن، نووسینی ئەحمەد خواجە چاپخانە شفق بغداد ١٩٦٧ بەرگی یەکەم.

٤ـ چیم دی = شۆرشەکانی شێخ مەحموودی مەزن نووسینی ئەحمەد خواجە چاپخانە راپەرین سلێمانی بەرگی دووهەم ١٩٦٨.

٥ـ چیم دی = شۆرشەکانی شێخ مەحموودی مەزن نووسینی ئەحمەد خواجە چاپخانە راپەرین ١٩٧٠ بەرگی ٣.

٦ـ شۆرشەکانی کورد نووسینی ـ علاءالدین سجادی ١٩٥٩ = ٢٦٥٩ کوردی ـ چاپخانە معارف بغداد.

٧ـ بارزانی و بزووتنەوەی رزگاری خوازی کورد، نووسینی کاک مەسعوود بارزانی، یەکەم راپەرینی بارزان «١٩٣٢ـ١٩٣١» چاپی دووهەم ١٩٩٢، چاپخانە خەبات.

٨ـ کۆماری کورد لە رۆژهەلاتی کوردستان ئامادەکردنی ئەحمەد حەمەمین (رەنجبار) سالی ٢٠٠٠ و هەروەها سەرۆک کۆماری کوردستان لە بەردەم دادگای ئێرانا، بەرهەڤکردنی بدرەالدین صالح، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.

٩ـ ئافرەتە ناودارەکانی کورد نووسینی عبدالجبار محمدالجباری چاپی کەرکووک.

ئەو پەرتووکانەی لە بارەی بزووتنەوەی رزگاری خوازی گەلی کوردن و لە زمانی کوردیەوە وەرمگێراونەتە سەر زمانی فارسی، ئەمانەن: پێویستە بەوە ئاماژە بکەم بەوە کە لەبەرگیروگرفتگی مالیەوە تا ئێستە نەمتوانیوە لە چاپیان بدەم.

١ـ کورد و کوردستان نووسینی موحەممەد ئەمین زەکی بەرگی ئەوەل، دووهەم چاپخانەی دارالسلامی بغداد ١٩٣١.

٢ـ بزووتنەوەی سماعیل ئاغای سمکۆ دژ بە رضاشاە، و لەشکەرکەشی سوپای ئێران بۆ «چهریق» و بایخی سوپاهی لوردوکەشی بە ناوبانگی «ساری داش» نووسین و وەرگێڕی و کۆکردنەوەی ئەحمەد موحەممەدی

٣ـ بنەماڵەی زانیاران نووسینی مەلا عبدالکەریمی مدرس

٤ـ یادداشت رەفیق حلمی، کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی نەمر بەرگی یەکەم چاپ بغداد چاپخانە معارف ١٩٥٦.

٥ـ یادداشت رەفیق حلمی، کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی نەمر بەرگی دووهەم چاپی بغداد ١٩٥٧.

بەرێز و سپاسەوە

سنە ـ ئەحمەدی موحەممەدی

٢٠٠٥ زایینی

زانا دانایە، دانا توانایە

# شۆڕشەکانی کورد

وە

## کورد و کۆماری عێراق

### لە رووی دەقی بنچینەی کۆنی خۆیەوە

پاگژی ئاگادارییەك لە سەر چاوە و بناغە و ئامار و شوێن و ژیانی کۆمەڵایەتی کورد، دروستبوون و پێکهاتنی قەومیەت، لاپەڕەیەکی درێژی کارەساتەکانی کورد لە هەموو روویەکەوە. بە جۆرێکی تێکڕایی ،تأریخێکی سیاسی عالەمی کورد، لە دەورەکانی کۆن و تازەدا.

کۆمەڵە کارەساتێکی مێژوویی شۆڕشی گێتی کوردیە، کە لە کانگای دەروونێکی پڕ خرۆشەوە پاڵەوانەکانی شۆڕشی ئەوگێتییە بە دەستیان داوەتێ و لاپەڕەیەکی زێڕینیان هێناوەتە بەرهەم، پێویستە هەموو کوردێك، وە بەڵکوو هەموو بێگانەیەك ئاگاداریی بە سەر ئەم زانیاریانەدا پەیداکا بۆ ئەوە بە دانایی خۆی ببێ بە ئەندامێکی توانا

عەلائەدین سەجادی

۲۶۵۹ی کوردی . ۱۹۵۹ی زایینی

کامپیوتر : ئاسیح رەحمانی ۰۹۱۸۷۳۸۰۲۸

ISBN: 964-06-2263-X